یاری لەگەڵ منداڵەکەت بکە

# 50 یاری

## پێویستە لەگەڵ منداڵەکەت بیکەیت






نووسینی

مریم حمودە

وەرگێڕانی

صدیق ڕەسول









چاپی یەکەم٢٠١٦




# ( ٥٠ ) یاری

## کە پێویستە لەگەڵ منداڵەکەت بیکەیت

# (٥٠) بیاری

# کە پێویستە لەگەڵ منداڵەکەت بیکەیت

**نوسینی** : مریم حمودە

**وەرگێڕانی** : صدیق رەسول

کوردستان / ٢٠١٦

# ناوەڕۆک











for game
play
with your
child

## پێشەكی

بێگومان یاری و گەمەكانی منداڵ لە ڕێگا شیاوەكانن بۆ منداڵێكی شادومان ، وەسەرجەم پسپۆران جەختیان لەسەر ئەوە كردۆتەوە كە گەمەو یاری كردنی دایك و باوكان لەگەڵ منداڵەكانیان كاریگەری گەورەی هەیە لەسەر منداڵ ، وەگەمەی دایك لەگەڵ منداڵ پەیوەندی منداڵ بە دایكیەوە بە هێز دەكات و زیاتر پەیوەست دەبێت پێیەوە.

بە دڵنیای دایك بەكەسی یەكەم دەژمێررێت لە ژیانی منداڵ ، لەڕێی دایكیەوە منداڵ فێری هەموو شتێك دەبێت.

وەگەمەو یاریەكان كە منداڵ لەهەر قۆناغێكی تەمەنیدا پەیڕەوی دەكات ڕۆڵێكی گەورە دەگێڕن لە ڕێكخستنی كەسیەتی منداڵ و بەدەستهێنانی لێهاتووی و شارەزای نوێ. وە پەرەسەندنی زرنگی منداڵ كارێكە ئەستەم نییە ، دەكرێت لە ماوەی پەیڕەوكردنی كۆمەڵێك یاری منداڵ تایبەتمەندیەكی زیرەكی دەستبخات ، بەڵام ئەم یارییە زرنگكەرانەی منداڵ كە گونجاون بۆ هەر قۆناغێكی جیای تەمەنی كە پیایدا تێپەڕ دەبێت پێویستە هەڵبژاردنیان تەوا و





دروست بێت . وە بۆ ئەوەی منداڵ پەیڕەوی یاری و چالاکیەکانی باخچە یان قوتابخانە بکات ، دەبێت مامۆستایان بەو یاریانە ئاشنابن کەگونجاون بۆ منداڵ لەم تەمەنەی کەتێیدایە.

یاری و گەمە نێوانی خێزان و منداڵەکانیان نزیک دەکاتەوە ، وەمنداڵان هەوڵ دەدەن زیاتر پشت بەخۆیان ببەستن و بۆ خۆیان کێشەکان چارەسەر بکەن، وەهەروەها خەیاڵ و سەرنجیان برەو پێدەدات. کەواتە یاری کلیلی فێربوونە لە قوتابخانە یاخود لەژیان بەگشتی.



## دایکی خۆشەویست سەرنجی یاری کردنی منداڵەکەت بدە لەکاتی یاریکردندا




بۆ نمونە وادابنێ مێردەکەت چاودێر بێت بەسەرتانەوە کاتێك یاری لەگەڵ منداڵەکەت دەکەیت ، لێی بگەڕێ مێردەکەت هەندێ خاڵی لاواز و بەهێز دیاری بکات.

**پیاوەکە پێویستە تێبینی ئەمانە بکات:**





- کێ جۆری یاریەکەی دیاریکرد؟ دایکە کە یان منداڵەکە؟
- یاریەکە چەندی خایاند؟
- کێ زیاتر خۆشی لێ بینی؟
- ئایا بۆ ئەو کەسەی تەماشای دەکردن دەرکەوت کە بە جۆش و خرۆشن لەیاریەکە؟
- ئایا ئەو هەڵسوکەتە جوان و چاکانەی منداڵ چین کە تۆ لەسەری هانت داوە و ستایشت کردووە؟

پاشان گفتوگۆ بکەن لەسەر باشی و لاوازیەکان و چۆنیەتی باشکردنی لاوازیەکان.

وە دایکی بەڕێز پلانێکی ئاسان و دیاریکراو دابنێ وەکو خوێندنەوە و زانیاری زیاتر لەسەر یاری منداڵ. وەلەماوەی وەڵامدانەوەی پرسیارەکانی پێشوو هەوڵی گۆڕانکاری بدە.

هەوڵدە چاودێربە بەسەر خۆتەوە بەشێوەیەکی ڕۆژانە ئەو گۆڕانکاریانەی بەدەستت هێناون . وەبیرت بێت دایکی بەڕێز تۆ زۆر کارامە و کارزانی بە منداڵەکەت بۆیە



متمانە بەخۆ بوونەوە وەڵامی پرسیارەکانی بدەرەوە و هەر خراپەیەکیشت لێ بینی خێرا هەوڵدە چاکی بکەیتەوە و پلانێکی بۆ دابنێ.

## پرسیار لەخۆت بکە؟

- ئایا جۆش و خرۆشم هەیە بۆ یاریکردن لەگەڵ منداڵەکە؟
- لەهەفتەیەکدا چەند جار گەمەی لەگەڵ دەکەم ؟ ماوەکەی چەندە؟
- ئەو ئاستەنگانە چین ڕووبەڕوم دەبنەوە لەکاتی یاریکردندا؟ وەچۆن چارەسەریان بکەم؟
- منداڵەکەم هەست بەچی دەکات لەبەرامبەر ئەو یاریەدا ؟ وەماوەی هەست بەخۆشی کردنەکەی چەندە؟ کەم یان زۆر...؟





# پێنج دەروازە بۆ کارامەیی لە یاریکردندا :

## ١ – کاتێکی باش و دیاریکراو

پلانێکی پێشوەختە دابنێ ١٠بۆ ١٥ خولەك ڕۆژانە دیاری بکە بۆ یاریکردن لەگەڵ منداڵەکەت وەدایکی بەڕێز بەشێوەیەك کاتەکە دیاری بکە کە باشترین کات بێت دووربێت لە هەموو وەرەزکەرە دەرەکیەکان و تەلەفزیۆنەکە بکوژێنەوە و هەموو منداڵەکانت کۆبکەوە بەیەکەوە یاریەکە هەڵبژێرن.

## ٢- هاوبەشی منداڵەکەت بکە.

پرسیاری لێ بکە لەو یاریەی خۆشی لێ دەبینێ و لێی بگەڕێ ئەو یاریەی حەزی لێیە هەڵی بژێرێت. وەپێت وابێت یان پێت وانەبێت کاتێك منداڵان بڕیار لەسەر چۆنیەتی یاریەکە و ماوەکەی دەدەن باشتر فێری دەبن و زیاتر چێژی لێ دەبینن ..

وەپشت بەستن بەخۆیان لەو بوارەدا دەبێتە هۆی زێدە



سەرنجیان بۆ ئاشنابوون بەیاریەکە ، وەجۆشیان زیاتر و هەڵسوکەوتیان جوانتر دەبێت وە گرنگترین شتیش ئەوەیە متمانە بە خۆبونیان بەبەهێزتر دەردەکەوێت . هەموو ئەمانە بەهۆی یاریەوەیە! ئەوەش ئاماژەیە کە ئەو دەسکەوتە باشانەی هەردوولا بەگرتنەبەری کۆمەڵە ڕێکارێکەوە بووە.

٣- خۆت دابەزێنە بۆ ئاستی منداڵەکەت

خۆ سازکردن بۆ یاری زۆر گرنگە . بەجەستە لە منداڵەکەت نزیکبە و ڕاستەوخۆ چاوی تێببڕە و گرنگی پێدانتی بۆ بەدیاربخە بۆ نمونە کاتێك منداڵکەت دەیهەوێت لەسەر زەوی یاری بکات تۆش لەگەڵی دابنیشە و بەشێوازی ئەو جوڵە و هەڵسوکەت بکە.

٤- بۆی باسبکە لەوەی دەیبینی

ئەی دایکی خۆشەویست ڕێ بە منداڵەکەت بدە گەمەکەی هەڵبژێرێت ، وکاتێ یاریەکە دەکات تۆ تەنیا جەخت لەسەر ئەوە بکەوە کە وەسفی ئەوەی بۆ بکەی کە دەیبینی بە دەنگێکی باش .





نمونە :" پارچە سورەكەت هەڵبژارد و خستتە سەر پارچە شینەكە " وەبەو شێوەیە سەرەڕای كارئاسانیەكە تەنیا كاتێكی دەوێت لە تۆوە بۆ ڕاهێنان لەسەری ، وەدایك بەبێ ئەوەی منداڵەكەی هەست بكات هەڵدەستێت بە ئاراستەكردنی منداڵ بۆ چەند هەنگاوێك بۆنمونە" یاری دەزانم ، ڕێگەمان بدە ئەم پارچەیەیان بخەمە سەر ئەم پارچەیە " واباشتر هیچ پرسیارێك نەكەی بەڵكو هەڵسی بەلاسای كردنەوەی.

٥- دەستخۆشی لێبكە لەوەی دەیبینی

كاتێ لێهاتوو بووی لە هەنگاوی پێشوو كە باسكردنی ئەوەبوو كە دەتبینی ، ئێستا هەوڵبدە لەبەرامبەر وەسفەكە پیاهەڵدان بكەی..نمونە" ماشاوالله ، كارەكەت زۆر جوانە ، هەستای بە دانانی ئەم پارچەیەیان لەسەر ئەم پارچەیەیان لەگەڵ جیاوازی قەبارەیان....هتد.

ئەی دایكی خۆشەویشت بەجەستە لەمنداڵەكەت نزیك بەرەوە، بەڕویدا پێبكەنەو ڕاستەوخۆ سەیری بكە ، دەستی



لێ بده و لەباوەشیبگره دەستی بەسەردابهێنه چونكه ئەمه كاریگەری زۆری هەیه لەسەر منداڵ . وەدودڵ مەبە له پیاهەڵدانی یەكسەر لەكاتی كارەكەدا ، چونكه ئەوە هانی دەدات لەسەر دووبارەكردنەوە . بێگومان منداڵ هەمیشه پێویستی بەوە هەیە كه بزانێت تۆ ڕازی له هەڵسوكەوتەكانی ئەمه فێری متمانەبەخۆبوونی دەكات وەفێری زێدەبوێری و دۆزینەوەی دەكات وەهەروەها فێری ئەوە دەبێت كه سەركەوێت بۆ ئاستی تۆ.





## یاریە دڵگیرەکانی منداڵ



منداڵ حەزیان لە خۆشی و شادیە ، بۆیە هەوڵمانداوە کۆمەڵە یاریەکی سەرنج ڕاکێش بخەینەڕوو بۆ منداڵان، بۆ ئەوەی منداڵ خۆشی و شادی لەکاتەکانی ببینێ لەگەڵ خوشك و برا و هاوڕێکانی لە ماڵەوە ، لەو یاریانەش ئەمانەن:

## هۆکارەکانی هەڵبژاردنی یاریەکانی منداڵ

هەر قۆناغێکی منداڵ پێویستی بە شێوەیەکی دیاریکراو ، وەیاریەکانی منداڵ لەو کارانەن کەزۆر لە دایکان لێی بێ ئاگان ، ئەمانەش کۆمەڵە هۆکارێکن کە پێویستە ڕەچاو بکرێن لەکاتی هەڵبژاردنی یاری



منداڵاندا:

- دڵنیابوون لەئاسودەیی و سەلامەتی یاریەکە : واتە یاریەکە پارچەیەکی بچوك نەبێت منداڵەکە قوتی بدات ئەگەرهات و هەستی بەمەترسیەکەی کرد یان کەدەرکەوت یاریەکە زیانی تری بۆ منداڵ هەیە لە قۆناغەکانی گەشەکردنیدا.
- ئامرازەکانی یاریکردن پێویستە پاك و خاوێن بن بەتایبەتی ئامرازەکانی یاری منداڵ لە مانگەکانی یەکەمی تەمەنیدا ، لەبەرئەوەی زۆربەی جار دەیخەنە دەمیانەوە ئەگەر خاوێن نەبوو ئەوە ڤایرۆس و بەکتریا دەگوازنەوە.
- دوورکەوتنەوە لە کڕینی ئەو یاریانەی گۆشەکانیان تیژ و بڕەرن.
- دەبێ ڕەچاوی ئەو یاریە بکرێ کە هاوسەنگە لەگەڵ کێشی منداڵ نەك کێشیان لەخۆی قورستر بێت.
- یاریەکە بەرگەی بەرگەگرتنی هەبێت بۆ ماوەیەکی باش و گونجاو بەبێ شکان و لەکارکەوتن.





- هەڵبژاردنی یاریەك كە سەرنج ڕاكێش و جوان بێت بۆ ئەوی سەرنجی منداڵەكە زیاتر ڕابكێشێ و هانی بدات بۆ یاریەكە و فێربوون لێی.
- گونجانی یاریەكە بۆ بایەخ پێدانی منداڵ و حەز و قۆناغەكانی گەشەی ، لەگەڵ باوەڕبوون بەوەی گەمە هەڵبژێردراوەكە لەلای منداڵ دەتوانرێ كۆمەڵە چەمكێكی لێوە فێر بێت.
- سوربوون لەسەر ئەوەی یاریەكە زۆرترین ئامانجی فێركاری بگرێتە خۆی بۆ كەمكردنەوەی تێچوی دارای كە بۆ هەندێك خێزان قورسە.





# منداڵەکەت فێربکە بەیاری

یاری منداڵان یەکجار زۆرن ! بەڵام کۆمەڵە یاریەك هەن منداڵ فێردەکەن و زانیاریەکانی زیاد دەکەن سەرنج و بڕی سەرنجی گەشە پێدەدەن ، ئەو یاری و گەمانەش بەیاریە زانستیەکان ناودەبرێن ، لەبەرئەوی منداڵ سودی لێ دەبینێ و کارامەی نوێی لێوە فێر دەبێت.

## یاریە خەمڕەوێنەکانی منداڵ

لەگەڵ منداڵەکەت بەیاریە ژیر کەرەکان لەڕۆژدا خۆت خەریك بکە بە هەندێ لەم یاریانەی خوارەوە :

گەمە تایبەتیەکان بۆ کارزانیە تایبەتیەکان

**خستنەڕووی تابلۆکان**: بۆ پاڵپشتکردنی دووربینین ( بۆ خوێندنەوە) وەکارامەییە جوڵەییە ئاسانەکان.

**چوارچێوەکان**: بۆ یارمەتی دانی لێهاتووی دۆزینەوەی شوێنەکان وەکارزانی خانو و ماڵ هۆکار و کاریگەرەکانی.





**سەیارەکان ، وێنەگرتنی باخچە و کێڵگەی ئاژەڵان و (وێنەگرتنی دیمەنەکان چیرۆکەکان):** بۆ یارمەتی دانی زیادکردنی توانای خەیاڵکردن و دانانی چیرۆك و تێگەیشتن لە جیهان.

**کتێبەکان:** بۆ پاڵپشتیکردنی تواناکانی بینین ، بیستن، زمانەوانی ، وەکارامەی لە پێش خوێندنەوەدا.

**ڕەنگەکان و کاغەزەکان:** بۆ مەدارکردن بەقەڵەم وەڕێکەوتن لە توانای نوسین تاکو تەواو دەبێت ، بەکارهێنانی هێماکان بۆ دەرخستنی ووشەو وێنەکان.

**پارچە و وێنە تێکەڵەکان:** ئەمە دەربڕی ئەو بیرەیە " شتە ونبووەکە چییە؟" بۆ یارمەتی دانی لێهاتووی لە ڕێکخستندا.

**پاسکیلی سێ تایە:** سەیارەی یاری : بۆ پاڵپشتی هێزی جەستەی و گونجان لەگەڵیدا.



**پۆشینی شتەکان:** بۆ یارمەتی دانی گەشەی خەیاڵی و تێگەیشتن لە خەڵك و جیهان ، نواندنی داهێنانی هەرەوەزکاری.







# كاریگەری كتێب و سرود لەسەر منداڵ



## كتێب و منداڵ

هیچ منداڵێك بچوك نییە بەرامبەر بە كتێب ، منداڵی گچكە زۆر چێژ لە دەنگت دەبینیٚ كاتێك دەخوێنیەوە ، وەتەركیزی لەسەر وێنە سەرنج ڕاكێشەكانە ، منداڵی گەورە كەم ئاماژە بۆ وێنە دەكات و ناوەكەی دەڵێت.

وەهەروەكو زانراوە ئەو منداڵانەی كتێب و چیرۆك بەشێكە لە ژیانیان ئاسانتر فێری خوێندنەوە دەبن لەوانی دیكە.



# سرود



سرودەکان بەسودن بەشێوەیەکی تایبەت ، وەسرود و هۆنراوە دەنگی و ئاوازیەکان دەچێنرێن لە عەقڵدا ، ئەو منداڵانەی فێری ئاواز بوون فێری خوێندنەوە دەبن بەتایبەتی ڕێنووس بەشێوەیەکی زۆر ئاسانتر لەوانەی خاوەنی ئەو تایبەتمەندیە نین. کەواتە بخوێنەوە سرودەکانی منداڵ هەر کاتێك کە توانیت یان شریتێك بکڕە و لەسەیارەکەدا بیخەرە ئیشەو.

وەکاتێ منداڵ دەچێت بۆ شاری یاری یان شوێنەکانی یاری کردن ئەوە بەدڵنیای چێژ دەبینێت بەزانینی ژمارەیەك لەم سرودانە.

وەلە دووایدا هەندێك یاری خۆش دەخەینە ڕوو کە دەکرێت منداڵ بیانکات لەهەر قۆناغێکی تەمنیدا.





# یاریه گونجاوەكانی منداڵ
# بۆ
# سەرەتای ساڵەكانی تەمەنی





# جیاکردنەوەی ڕەنگەکان

منداڵ دەتوانێت ڕەنگەکان جیابکاتەوە بۆ نمونە ڕەنگی سوور لەسەرەتای تەمەنی ، کە عادەتەن یەکەمین ڕەنگە کە منداڵ دەتوانێ ببینێ ، وەمنداڵان دەتوانن شیکاری ڕەنگەکان بکەن بەشێوەیەکی دروست بۆیە بەسودە دانانی





یاریەکی مۆسیقی ڕەنگین لەسەر جێگەی منداڵ لەڕۆژی یەکەمەوە جا کاتێ دەوری منداڵ بەم شێوەیە دەوڵەمەندکرا ئەوە هەلی گەشەکردنی ژیری زیاد دەکات .

وەلەگەڵ مانگی سێیەمی تەمەنیدا منداڵ دەتوانێت یارییە هەڵبژێرراوەکەی جیا بکاتەوە و هەوڵدەدات بگات پێی یان دەستی پێوە بگرێ.

وەگرنگە کە یاریەکانی منداڵ ڕەنگاو ڕەنگ بن دەست پیانەر و شێوە جیاواز بن بۆ گەشەکردنی هەستی منداڵ لەجیاکردنەوەی شتە جیاوازەکان لە ڕێگەی بینینەوە.



# یارییە دەنگیەکان



لەو قۆناغەی تەمەنیدا ئەو یاریانە دەردەکەون کە دەنگ و ڕەنگی جیاوازیان هەیە زیاتر لەهەموو جۆرە یاریەکانی تر کە گونجاوی منداڵە لەبەر ئەوەی منداڵ لەو تەمەنەدا دەگەڕێت بە دووای شتەکان و دۆزینەوە دەکات ، وەئەو یاریانە یارمەتی منداڵ دەدەن لەسەر دۆزینەوە و هاندانی هەموو هەستەکانە وەکو بیستن و دەستلێدان و بینین....





# خستنەڕووی شێوەکان



لەو یاریە بە سودانەی کە دەتوانرێ بکرێن لەگەڵ منداڵ لەم قۆناغەدا بریتییە لە خوێندنەوەی چیرۆکە کورتەکان ، وەنیشاندانی تابلۆ و وێنە بە تەباشیر، بەیەکەوە بەستنی چوارچێوەکان وەقەڵەمی ڕەنگاو ڕەنگی بێ زیان ، وەسندوقی لم و پاسکیلی سێ تایە.



# گونجان لەگەڵ یاری



منداڵ ئاشنای هەندێك شت و كەسایەتی دەبێت كە لەلای دڵگیرن ، وەئەو یاریەی زیاتر لای ئەو باشە و بەسودە ئەوەیە كەبەیەكەوە دەلكێندرێن و ڕا دەكێشرێن یان بۆ دوواوە و پێشەوە دەڕۆن یان لەو جۆرەی كە یارمەتی دەری سەركەتنە لە یاری ڕەنگ و شێوەكان وەئەو پەرتوكە دروستكراوانەی لە قوماشن یان لە پلاستیك وەئەوە جیادەكرێتەوە بە وێنەی گەورەی سادە.



# یاریەکانی گەشە پێدانی کارامەیی



لەم قۆناغەدا منداڵ کارامەیی و لێهاتووی تازە دەدۆزێتەوە لە ناسینی ئەو جیهانەی دەوری داوە ، بەبەکارهێنانی پێنج هەستەکانی سەرەتاش منداڵ لەکرداری لاسایکردنەوە دەست پێدەکات .

دەکرێت دایك هانی منداڵەکەی بدات لەسەر بیستنی سرودی خەمرەوێن و بەچێژ لێی وەدووای بیستنی سرودەکە داوای لێ بکرێت لەبەردەمی دایك و ئەندامانی تری خێزانەکەی ئەم سرودە بڵێتەوەبەمەش گەشە بەو بەهرەی ناخی دەدرێت لەماوەی یاریەکەدا.



# یاری بە چوارچێوە و ڕووەکان




یاری بە چوارچێوە و ڕووەکان زیاتر لە هەموو یاریەك خۆشترن لای منداڵ . تیایدا منداڵ فێری هەڵە و دروستی دەبێت لە کاتی پێکەوەبەستنی ڕووەکان بەشێوەی ڕاست و وەلەشوێنی دروستی خۆی.

وەهەروەها یاریکردن بە قەڵەم و کاغەز لەیاریە گونجاوەکانی منداڵن لەو قۆناغەدا.





# برین و لكاندن



لــــەم قۆناغــــەدا پێگەیشتنی ژیـری لای منـداڵ دەردەكـەوێت وە منداڵ به چالاك دەردەكەوێت لە تێگەیشتن و بەكارهێنانی ژیـری و بیژتنـدا ، وە منـداڵ بەرەونـەق دەردەكـەوێت بـه خۆسەرقاڵكردنی بە چالاكیە دەستیەكان ئەو یاریە دەستی و پشكنینانەی برین و لكانـدن و پێكەوەبەستنی شێوەكان لەیاری گونجاون بۆ ئەم قۆناغە. وە دایك دەتوانێت لەماڵەوە كچەكەی فێری چێشت لێنان بكات بە وەستاندنی كچەكەی لای خۆی لەكاتی خواردن ئامادەكردن .



# جۆلانەی منداڵان



ئەم یاریە بۆ تەمەنی ٦ مانگی گونجاوە بۆ ڕۆیشتنی منداڵ كە لەڕەوڕەوە باشترە جگە لەو مەترسیانەش بەهۆی ڕەوڕەوە وە توشی منداڵ دەبن وەبە ئەزموون سەلمێنراوە كە ئەمە زۆر بەسودە بۆ بەهێزبوونی ماسولكەكانی پێ وەهەركەسێك بەكاری هێنابێت لە چاكەی خواوە بۆتە هۆی ڕۆیشتنی هەندێك جار لە پێش نۆ مانگی وەلە هەموو حاڵەتەكاندا ئەمە بەندە بە مناڵەوە .





# دروستکردنی شت بەهەویری دەستکرد

بۆ تەمەنی دووساڵ و نیوی دەبێت یان جگە لەوتەمەنەش کاتێك دایکەکە دڵنیابێت کە نایخوات.

سودەکانی:

بەهێزبوونی ماسولکە ووردەکانی دەست سەرباری گەشەبونی خەیاڵ لای منالْ هەروەك دایکانیش لەوە ووریادەکەینەوە کە باشترین جۆری قوڕی نەرمە وەئەوەی شێوەی ڕەنگی لە هی زەوی نەچێت. ئەوەی گوشرانی لەسەر دەکرێت.





# چوار ڕووه كارتۆنیەكان یان داریەكان



بۆ یەكساڵی و دووساڵی دەبێت كەبۆ فێربوونی منالْ و شارەزای لەبینا دروستكردن و زنجیربەندی زۆر گرنگە بۆ داهاتوی بەتایبەت لە خوێندندا ، بەڵام دەربارەی چوار ڕووە تەختە داریەكان جۆریان زۆرە لە بازاڕەكان وە واباشە ڕەنگاو ڕەنگ بێت تاكو منالْ فێری بینا و ڕەنگەكان بێت پێكەوە بەمەش دوو چۆلەكە دەپێكین بەیەك بەرد .



# چەکوش و تۆپە خلۆربووەکە



ئەم یاریەش بۆ تەمەنی دووساڵی و سێ ساڵی گونجاوە.



## سودەکانی :

- ✓ بەهێزبوونی ماسولکەکانی دەست.
- ✓ هێز بە جوڵەی بینین دەدات.
- ✓ گرنگە بۆ منالْ لەم قۆناغە پێش چوونی بۆ باخچە لە پێش نووسین کارامەیی لێهاتووی فێر بکرێت.

بێگومان کاتێك منالْ چاوی بەسەر تۆپەکەیە کاتێك دەخلیسکێت بەسەر خلۆرکەرەکە خلۆر دەبێتەوە یارمەتی دەدات بۆ بەدوواداچونی و شارەزای لە تێکەڵکێشی پیت و ژمارەکان وەخلۆرەکە تا درێژتر بێت باشترە.





# راكیشان و دانان لەشوێنی شیاو



زۆر شێوەی هەیە، دەكرێت بۆ تەمەنێك كە لە ساڵ و نیوی دایە وەبۆ ئەوانەی لەپۆلە بەرزەكانی خوێندنی سەرەتاین ئاڵۆز و قورس نییە.



## سودەکانی:

بۆ گەشەی ماسولکەی بینین و جوڵەی ڕێکی منداڵ بۆ دانانی شتێك لە شوێنی خۆی بە ووردی وەدەتوانرێت لەم یاریەوە سود وەربگیرێ بۆ ناسینی ناوی ئاژەڵان هەندێکیان هەستیان بۆ دانراوە وەك کاتێك مریشکەکە لە شوێنی خۆی دادەنێیت دەنگی مریشکەکە دێت وەکاتێك یاریەکە کار و فرمانی زیاتریان بۆ دادەنرێت سودیان زیاتر دەبێت.





# مەتەڵ



ئەم قۆناغە کە قۆناغی دووساڵ بۆ چوار ساڵیە بەوە دەناسرێتەوە کەزۆر پرسیار دەکات چونکە عەقڵ و جەستەی گەشەدەکات و ووردە ووردە درك بە شتەکانی دەوروبەر دەکات و لێکیان دەداتەوە بۆیە مەتەڵ بەیەکێك لەو راهێنانە باشانە دادنرێت کە خەیاڵ و داهێنانی منداڵ بەهێز دەکات



# یاری خەیاڵی



ئەم یاریە بۆ تەمەنی دووساڵ و نیوی گونجاوە تاوەکو دوای قۆناغی چونە قوتابخانە و فراوانبونی خەیاڵ





## سودەکانی :

ئەی دایکی ئازیز منداڵەکەت خەیاڵی فراوان نییە و بەپێی عەقڵی خۆی خەیالیشی سنوردار و کەمە ، کەواتە هەمیشە چاودێری بکە بۆ ئەوەی بەشێوەیەکی باش گەشە بکات و بیری فراوان بێت ئەمەش بەوە دەبێت کە چاودێری ئەو یاریانەی بکەی کە دەیکات و بۆ خۆشت لەگەڵی بەشدار بیت جار جار بۆ ئەوەی گەر لەکاتی یاریکردندا هەڵەیەکت لێ بینی خێرا ئاگاداری بکەیەوە و نەبێتە بەشێك لەکەسایەتی منداڵەکەت .



# ئەو یاریانەی گونجاون
# بۆ
# منداڵ لەتەمەنی شەش ساڵی بەرەو سەر







# یاری تۆقەکان



## کەلوپەلە داواکراوەکان

- ✓ وەرەقەیەکی کارتۆنی .
- ✓ ئاو یان لم.
- ✓ شوشە پلاستیکێکی گەورە.
- ✓ کەرەستەیەکی لکێنەر.
- ✓ مەقەست.



**شێوازی كاركردن تیایدا ( ڕێگای بە كارهێنان )**

١. بڕینی وەڕەقە مقەباكە بەمەقەست وەكو دەزویەكی درێژ.

٢. دروستكردنی بازنەكان لەدەزووە كاغەزەكەوەلكاندنی بەمادده گەیەنرەكە.

٣. پڕكردنی بوتڵە شوشكە لەئاو یان لە لم وە داخستنی بە باشی

٤. گرێدان بە تەوقەكان كە بەكاغەز دروستكراون پاشان هەوڵی فڕێدانیان لە هەوا بۆ ئەوی بەربینەوە لەدەوری گەرووی بوتڵە شیشەكە.

٥. بەشداری كردنی یاریەكە لە نێوان ژمارەیەك منالْ وەبراوە ئەوەیە كەسەركەوتوو ئەبێت لە دانانی زۆرترین ژمارە لەتەوقەكان لە دەوری شوشەكە.







# یاری كاراكتەری بچوك



لــەو یاریــەدا دایــك و بــاوك ڕســتەیەكی ســادە هەڵدەبژێرن كەژمارەی ووشەكانی لە ١٠ ووشە زیاتر نەبێت پاشان داوا لە منداڵ دەكەن كە دووبارەی بكەنەوە بە شێوە قسەكردنی جیاواز واتە مورادیف و هاووشەی تری ئەم وشــەیە نمونــە ( خــەمباری ، دڵخۆشــی ، مــا نــدوێتی ، خێرای)



## کەلوپەلەکان :

کۆمەڵێک لەمانە

- سێگۆشەیەکی کارتۆن.
- چوارگۆشەیەکی کارتۆن.
- لاکێشەی کارتۆن.
- بازنەیەکی کارتۆنی.

## شێوەی یاریەکە :

- منداڵەکان دابەش دەبن بۆ کۆمەڵە گروپێک ، با لەسێ کۆمەڵ پێک
- هەرکۆمەڵەیەک شێوە ئەندازەیەکی جیاواز پێشکەش دەکات.
- داوادەکرێت هەر کۆمەڵەیەک کە شتە وێکچووەکان کۆ بکاتەوە و دایان بنێت لەسەر یەکتری.



ئەم یاریە بەوە دەناسرێت کە جوڵەیی و ژیرکەرەیە بۆ هەموو منداڵێك گونجاوە.

وێنەی گەورە لە بەرخ و بزن و مانگاو ئەسپ ئامادە دەکرێت ، وە دەلکێنرێ لە چوار لای ژوورەکە، دووای ئەوە سرودێك لێدەدرێت لەکاتی وەستانی سرودەکە داوا لەمنداڵەکان کە روبکەنە لای ئەو گۆشەیەی کە هەڵیان بژاردووە پاشان یەکێك لە منداڵە گەورەکان دەوەستێت و پشتی لەوانی تر دەکات و بانگی یەکێ لەناوی چوار ئاژەڵەکان دەکات ، پێویستە کە هەموویاریکەرێك روو لەو گۆشەیە بکات کە وێنی ئاژەڵە داواکراوەکەی لێ هەڵواسراوە، وەئەوەی دەوەستێت لە گۆشەیەکی هەڵە لەیاریەکە دەردەکرێت ، وەسەرکەوتووش ئەو کەسەیە کە دەمێنێتەوە هەتا کۆتایی.



# وێنە کێشان



ئەم یاریە گونجاویشە بۆ منداڵانی تەمەن گچکە ، وە دەتوانرێت کە ئەندامانی خێزانیش چێژ وەربگرن لە وێنەکێشان و ڕەنگکردنی وێنەکە لە کەشێکی خۆشدا.





سودەکەی :

گرنگترین شتی بریتیە گەشەکردنی خەیاڵ و هەستی هونەری و بەتاڵکردنی حاڵەتە باش و خراپەکانی منداڵ ، بەلام ئەی دایکی خۆشەویست سوربە لەسەر ئەوەی کە داهێنانی منداڵەکەت کۆت و بەند نەکەی بە فشار خستنەسەری بە وێنە کێشانی شتێك کە ئەو حەزی لێناکات بەڵکو بە دڵی تۆیە! بەڵکو وازی لێبێنە وێنە بکێشێت بەخەیاڵی خۆی ئەوەی کە حەزی لێیە.

تیبینی :

لۆمەی منداڵەکەت مەکە ئەگەر وێنەی کێشا لەسەر دیوار بەڵکو لۆمەی خۆت بکە کە دووای تەواوبوونی ماوەی وێنەکێشانەکە پەڕ یاخود ئامرازەکانی وێنە لەسەر دروستکردن لە شوێنی بەرز دادەنێیت و دەستی پێناگات.



# یاری بیرکردنەوە



مامۆستا هەڵدەستێت بەکردنی کۆمەڵە پرسیارێک دەربارەی هەڵوێستێك یان فکرەیەك یان ووشەیەك ، داوا لە منداڵان دەکرێت کە بیر لەم ئەرکەیان بکەنەوە دووای ئەوە گوێ دەگیرێت لە کاردانەوەکانیان بە ووریاییەوە .

ئەو یاریە ئامانجیەتی کە ووریای منداڵان ڕابکێشێ وەبیری تازەیان فێر بکات.





# یاری ماسیە دیلەكان



- ئەم یاریە پێویستی بە ٢٠ منداڵە
- منداڵان بۆ دوبەش دابەش دەبن، یەكەمیان تۆڕەكە ئەوی تریان ماسیەكانن .
- سـرودێكی خۆشـیش لەڕێگـەی ئامێرێكـەوە پـ دەكرێتز



- لەگەڵ دەستپێکی سرودەکە منداڵانی کۆمەڵەی یەکەم کە تۆڕکەن هەڵدەستن بەدروستکردنی بازنە بە دەستەکانیان بەشێوەیەکی درێژی ئاسۆی پاشان ماسیەکان لە نێوانی دەستەکانیان دەچنە ژوور و دێنە دەر لە تۆڕەکە.
- لەکاتی وەستانی سرودەکە منداڵەکان دەستیان دێننە خوارێ و ماسیەکان دەگرن و ئەوانەی دەمێننەوە لەدەرەوەی تۆڕەکە براوەی ئەم یاریەن و پاشان ماسیە دیلکراوەکان ڕێکدەخرێن لە بازنەیەك وەسرودێك سەرلەنوێ پێدەکرێتەوە دووای دیل بوونی هەموو ماسیەکان ڕۆڵی هەموو منداڵەکان تەواودەبێت لە دەور پێدانیان.





# یاری چرپاندن



- منداڵە یاریکەرەکان لە بازنەیەك دادەنیشن کە ژمارەیان لە دەوری ٢٠ یاریکەر بێت.

- یاریکەری یەکەم بەدەنگێکی نزم دەستپێدەکات لە



گوێچکەی منداڵی لای ڕاستی وەئەو منداڵەش دەیگەیێنێت

بە هی سێیەم .

- یاریەکە بەم شێویە دەڕوات تا دەگات بە کۆتای یاریکەر لە بازنەکەدا
- وەداوا لەیاریکەرە کۆتاییەکە دەکرێت کەناوی ئەو ووشەیە بڵی کە بیستوویەتی پاشان داوا لەیاریکەری یەکەم دەکرێت کە ئەو ووشەیە بڵیّ کە درکاندوویەتی دەبینین کە تواو جیاوازە لەو ووشەیەی کە یاریکەری کۆتا ووتویەتی .

- یاریەکە پێویستی بە ژمارەیەکی زۆر لە منداڵ هەیە کەلانی کەم بگەن بە ٢٠ یاریکەر دوو منداڵ
- هەڵدەبژێردرێن لە منداڵەکان یەکێکیان ساحیر و ئەوەی تریان سوارەکە دەبێت .
- داوا لە منداڵان دەکرێن کە بجوڵێن لە یاریەکەدا ، ئەو منداڵەی کە ساحیرەکە دەستی لێ دەدات چاوی دەنوقێنێ ، بەلاّم ئەگەر ساحیرەکە دەستی لە سوارەکەدا ئەوا یاریەکە تەواو دەبێت و دوو منداڵی تازە هەڵدەبژێردرێن .
- واپێویست دەکرێت کە لە یاریەکەدا منداڵان هاوپەیمانی سوارەکە بن ولەوە نەبن کە ساحیرەکە دەستیان لێ بدات
- ئەگەر سوارەکە دەستی لە ساحیرەکەدا ئەوە ئەو سەرکەوتووە.



# یاری فێرکردنی بێدەنگی



- ئەم یاریە دەکرێت لەگەڵ منداڵان لەڕێی ئاماژەکردنەوە.
- داوا لە منداڵان دەکرێت ووشەکان بە ئاماژە بخوێننەوە کاتێت داوایان لێدەکرێت.
- ئامانجی ئەم یارییە راهاتنی منداڵانە لەسەر سەرنجدان و ووردی و تیبینی و بەشداری کردن.



# یاری شەبەکە



## کەل و پەلە داواکراوەکان :

- تۆپێکی پلاستیکی کێش سوك.
- تۆڕێك بۆ کۆکردنەوەی تۆپەکان.





## شێوازی یاری كردنەكە :

- یارییەكە پێویستی بە دوو تیپ هەیە كە هەر یەكەیان پێك بێ لە دوو كەس ، یەكێكیان سەڵلەكە دەگرێت و یەكێكیشیان تۆپەكە.
- دوو هێڵ دەكێشرێت لەسەر زەوی یەكێك لەیاریكەرەكان لە پشت هێڵێكیانەوە دەوەستێت و سەڵلەكە دەگرێت و یاریچی دووەم لەپشت هێڵی دووەمەوە دەوەستێت .
- یاریكەری یەكەم تۆپ لە دووای تۆپ فڕێ دەدات و یاریچی دووەمیش ئەركیەتی كە تۆپەكان بگرێتەوە بەو سەڵلەیەی پێیەتی و لە چێوەی ئەو هێڵەی بۆی دیاری كراوە دەرنەچێت.
- ئەو تیپە سەركەوتن بەدەست دێنێت كەزۆرترین ژمارەی تۆپ كۆدەكاتەوە لە ناو تۆڕی سەڵلەكە.چونكە ئەوانەی دەكەونە دەرەوەی تۆڕی سەڵلەكە حیساب ناكرێن.



# یاری ژێر پەردە



## کەلو پەلە پێویستەکانی :

- ✓ فڵچە ، تۆپ ، قاپ ، پەرداغ ، قەڵەم ، کلیل ، زنجیرە.
- ✓ چەرچەفێکی گەورە یان پەردەیەك لە قوماش.
- ✓ مێزە
- ✓ چەند کاغەز و قەڵەمێك.





## شێوەی یاریکردنەکە :

- دانانی هەموو شتەکان لەسەر مێز.
- ئاگادارکردنەوەی منداڵان کە تەماشای ئەو کەلو پەلانە بکەن کە لەسەر مێزەکەن ، پاشان داپۆشینی بەپەردەکە.
- پرسیارکردن لە منداڵان دەربارەی ئەو شتانەی کە لەژێر پەردەکە دان و شوێنەکانیشیان دەست نیشان بکرێت. لەسەریانە هەر یەکێکیان ئەوەی کەبیری دێت بینوسێت.
- لابردنی پەردەکە تاکو هەر منداڵێك ئەو شتەی بیری نەبووە بۆی ئاشکرابێت، وەئەوەی زۆرترین شتی سەر مێزەکەی بیر هاتبێتەوە ئەوە ئەویان براوەی یاریەکەیە.



# یاری گوێدرێژی کوێر



✓ دوو یاریکـەر هەڵدەبـژێردرێن و هەریەکـەیان کاغـەز و قەڵـــەمێکی پێـــدەدرێت و پاشـــان ڕووناکیـــەکان دەکوژێنرێنەوە .

✓ داوا لە منداڵان دەکرێت وێنەی گوێدرێکی کوێر لەسەر کاغەز بکێشن و گوێدرێـژێکی تـەواو بێت تـەنها چاوی نەبێت.

✓ ڕووناکیـــەکان دادەگیرســـێنرێن وەلێـــرەدا هـــەموویان پێدەکەنن لەو وێنانەی کێشاویانە.

✓ دەتوانرێـت ئەمـە ئەنجامبـدرێت لـە ڕووناکیشـدا بـەڵام دروای داپۆشینی چاوی منداڵە یاریکەرەکان.



# یاری پەت و جل گر



**کەلوپەلە داواکراوەکان :**

- چەند جل گرێك
- پەت.



## شێوازی یاریەکە :

١) دوو هاوڕێ لە هاوڕێکان هەڵدەستن بە توندکردنی پەتەکە.

٢) جل گرەکان بە پەتەکەوە دەبەسترێنەوە.

٣) کۆمەڵێك لە هاوڕێکان دێنە پێشەوە بۆ پێشبڕکێکە و هەریەکەیان دەستی لە پشتەوە دادەنێت و هەوڵدەدات بە ددانەکانی جلگرەکان لە پەتەکە بکاتەوە.

٤) ئەوەی دەیباتەوە ئەو کەسەیە کەزۆرترین جلگر کۆدەکاتەوە لەکەمترین کاتدا.

٥) دەتوانرێت کاتیش دیاری بکرێت بۆ پێشبڕکێکە و باوای دابنێن یەك دەقەبێت.







# یاری ووشەی نامۆ



**کەلوپەلەکانی :**

سێ تابلۆی گەورە کەشەش ووشەی لەسەر نوسرابێت و لە نێوانیاندا ووشەیەکی نامۆی تێدا بێت کە پەیوەندی نییە بە پێنج ووشەکانی ترەوە.



**شێوازی یاریەکە :**

تابلۆکـان ئامـادەدەکرێن و نیشـانی منداڵـە یاریچیەکان دەدرێت و داوایان لێدەکرێت کە ووشـە نامۆکـە لـە نێوان ئەو ووشـانە دەربهێـنن، نمونـە تابلۆیـەك لەسـەری نوسـرابێت ( قەلـەم ، ڕاسـتە، چـەقۆ ، ڕەشـکەرەوە ، کتێـت ، دەفتـەر ) وەلێرەدا ووشـەی چـەقۆ ئەو ووشـە نامۆیەیـە لـە نێوانی ئەم شەش ووشەیەدا.





# یاری كلكی گوێدرێژ



## كەلوپەلە داواكراوەكان:

كاغەزێكی گەورە ، مەقەس ، دەرزی ، دەموس (دەرزی سەرخڕ) ، پەڕۆیەكی گەورە بۆ داپۆشینی چاوەكان.



## شێوازی دروستکردنی یاریەکە :

١) وێنــەی گوێــدرێك دەکێشــرێت بــەبێ کلــك لەســەر کاغەزێکی گەورە کەدەکرێت مەترێك و حەفتا سانتیم بێت هەڵدەواسرێت بەدیوارەوە.

٢) وێنەی کلکی گوێدرێژ دەکێشرێت پاشان دەبڕدرێت بە مەقەست.

٣) هەڵبژاردنی یاریچیەکان تەواو دەبێت پاشان پەڕۆیەکە بەسەر چاوی منداڵەکان دەدەنرێت بۆ ڕێگری لە بینین دووای ئەوە هەر یەکەو کلکێکیان پێ دەدرێت و لەســەر لایــەکی تابلۆیەکــەش دەمــوس هەیــە دەبێــت بیدۆزێتەوە و کلکەکەش لە شوێنی کلکی گوێدرێژەکە بنوسێنێت.

٤) براوە ئەو کەسەیە کەکلکەکە لەشوێنی شیاوی خۆی دادەنێت .





# یاری خاڵی هاوبەش



یاریەکـــە جـــەخت لـــەوە دەکاتـــەوە کـــە دایکەکـــە یـــان باوکەکە دوو شت بۆ منداڵەکەی باس بکات و داوای لێ بکات کە خاڵی هاوبەشی نێوانی ئەم دوو شتە بڵێت ، کە لـە ڕوواڵەتـەوە وادەردەکەوێت کە هیچ پەیوەندی و خـاڵێکی هاوبـەش لـە نێوانیانـدا نییـە ، بـەڵام لەڕاسـتیدا پەیوەندیان هەیەو پێویستە لەسەر منداڵ کە بیدۆزێتەوە.

ئەم یارییە هانی منداڵ دەدات لەسـەر بیر و تەرکیزکردنەوە لەسەر خاڵە هاوبەشەکانی نێوان خۆی و کەسانی تر نەك هەر تەنها بیر لە جیاوازی و خاڵی جیاوازیان بداتەوە.



# یاری فەرهەنگی وێنەدار




- ئەم یاریە گونجاوە بۆ منداڵانی باخچەی ساوایان تاوەکو پۆلی شەشی بنەڕەتی
- ئامانجی فێرکردنی منداڵانە لەکارامەی بەکارهێنانی قاموس ( فەرهەنگ)
- مامۆستا داوا لەهەر قوتابیەك دەكات كە دەفتەرێكی بەتاڵ و هیچ لێ نەنوسراو ئامادە بكەن .





- دەفتەرەکان بەپێی پیتەکانی هیجائی دابەش دەکرێن.
- هەموو قوتابییەکان ووشەنوێیەکان تۆمار دەکەن کە گوێیان لێ دەبێت لە فەرهەنگەکە بۆ ئەوە ببێتە پەناگەیەکی گەڕاوە بۆ فێربوونی ووشەو شتەکان.
- واچاکە کە فەرهەنگەکە وێنەی لەگەڵ بێت بۆ ڕاکێشانی ووریای منداڵان.





# یاری فاسۆلیاو سینیەكان



**كەلوپەكەكانی:**

- سێ سینی بەتاڵ.
- پازدە دەنك لە دەنكی فاسۆلیا.





## شێوازی یاریەکە :

- ئامادەکردنی سێ سینی لەسەر مێز لەبەردەم منداڵەکان.
- دانانی پێنج دەنك فاسۆلی لەهەر سینیەیەك لەو سێ سینیانە.
- داوا لە منداڵان دەکرێت کە ژمارەی ئەو دەنکە فاسۆلیانەی لەسەر سێ سینیەکە هەن ئەژمار بکەن.
- ئەم یاریی یارمەتیدەرە لە فێرکردنی شارەزای منداڵان لە ژماردن و لێکدان و کردارە ژمێریاریەکاندا.





# یاری كۆتای ووشەكان



ئەم یاریە بریتییە لەوەی كە كۆتای ووشەكان بەیەكەوە دەبەسترێتەوە بە ووشەی كۆتای ڕستەكەبۆ نمونە: دایك ووشەیەك دەڵێت لەسەر منداڵە كە ووشەیەكی نوێ لەدووای كۆتا ووشەی ڕستەی دایكی بڵێت وەكو ( دایك دەڵێ: سێو خۆشە ) منداڵەكەش دەڵێت ( خۆشەو ڕەنكیشی سورە) گەورەی و گچكەی ڕستەكان پەیوەستە بە خەیاڵ و فراوانی بیری دایك و منداڵەكە و هەر كاتێك زیاد بوو خەیاڵ و بیریان ئەوە زیرەكی منداڵەكە زیاد دەكات.





# یاری بۆڵینگ



**کەلوپەلە پێویستیەکانی :**

- دە بتڵە ئاوی بەتاڵ.
- تۆپ.



**شێوەی یاریەكە :**

١) بتڵەكان ڕیز دەكرێن بە دانانی بتڵێك لە پێشەوە وە ڕیزی دووەم دوبتڵ ڕیزی سێیەم سێ بتڵ ڕیزی چوارەم چوار بتڵ .

٢) پێشبڕكێكار لە دووریەكی گونجاوەوە دەوەستێت بۆ تۆپ فرێدان و لێدانی بتڵەكان.

٣) ئەو منداڵەیە دەیباتەوە كە زۆرترین بتڵ بەر دەداتەوە لەیەك جاردا.





# یاری ترسان لە پیتی واو



مەبەست لەم یاریە بریتیە لەوەی کە دایك چەند ووشەیەك لەبەردەم منداڵەکەی دەردەبڕێت ، لەسەر منداڵیشە کاتێك کە گوێبیستی پیتی واو دەبێت لە هەر ووشەیەکدا چاوەکانی بنوقێنێ و لێی ووریابێت .ئەم یاریە تەرکیز و ووریای منداڵ زیاد دەکات و دەیکات بە گوێگرێکی باش.



# یاری ڕاهێنان لەسەر زیرەکی



ئەم یاریە پێویستی بەزیاتر بەکەسێك هەیە و ئامانج لەم یاریەش بە هێزکردنی بیر و تەرکیزی منداڵە .

ئەم یاریە تەواو دەبێت لەو کاتەی کەیاریکەری یەکەم بە ووتنی ووشەیەك دەست پێدەکات و لەسەر یاریکەری دووەمە ئەو ووشەیە باس بکات





وەسیێیەم و ئەوانی وەدەستەواژەیەکی تریشی بۆ زیاد بکات یەکەم دەڵێت شەربەتەکەم تریش بەم شێوەیە .بۆ نمونە ( دەڵێت شەربەتم خواردە و خواردەوە ، وە ددوەمیش دەڵێ شەربەت و شیر و شیریشی لەگەڵ بوو وەسێیەم شیرینیشم خواردەوە ....).



# یاری پەرداغە ئاو



ئەم یاریە بریتیە لە جوڵەی هێواشی منداڵ و توانای پارێزگاری کردن لە وەی لەناو دەستەکانی دایە.

دوو پەرداغی پڕ لە ئاو ئامادە دەکەی و پاشان منداڵەکان دابەش بکە بۆ دوو تیپ و هەر تیپێکیش بووەستن لە ڕیزێکی وا کە لەئاستی یەك بن .





پەرداغەکە دەدرێت بەوەی لەسەرەتای ڕیزەکە دایە پاشان لەسەریەتی کە سوڕانەوەیەك تەواو بکات بەدەوری ژورەکە وە کوپە ئاوەکەش لەدەستیەتی تا دەگات بەیاریچی دووەم لە تیپەکەی و کوپە ئاوەکەی پێ دەدات و یاریکەری دووەمیش بەهەمان شێوەی یاریکەری یەکەم دەسوڕێتەوە و هەمان ئەرکی هەیە بەم شێوەیە هەتا کۆتای دێت پاشان لە کۆتایدا ئەم تیپە سەرکەوتوو دەبێت کە تەواو دەبێت پێش تیپی دیکەو پەرداغە ئاوەکەشی زۆرترین ئاوی تێدا ماوە.

بێگومان ئەم یاریە وا گونجاوە لە دەرەوەی ماڵ و دەشتوانرێت لە یاریگا بکرێت و بازنەیەك لەسەر زەوی بکێشرێت بەگەچ بۆ سوڕانەوە بە دەوریدا.



# یاری چەند ژمارە هەیە



ئایا تۆ باشی لە خەملاندن؟
قاپەکە پڕ بکە ( دەتوانی کیسێك یان هەر قاپێك بەکاربێنیت شیرلانەمەنی تێدا بێت)
پاشان داوا لە منداڵەکان بکە کە ژمارەی شیرنەمەنیەکانی ناو دەفرەکە بخەملێنن ، ئەو منداڵەی ژمارەی ڕاست یان





نزیك لەڕاست دەزانێت سەردەکەوێت و دیاریەکی پێدەدرێت و پاشانیش شیرنەمەنیەکانیش دابەش دەکرێت بەسەر منداڵەکان . پێویستە کە کیسەکە یان قاپەکە بە پێی ژمارەی شیرنەمەنیەکان بێت بۆ ئەوەی خەملاَندنەکان لەسەر بنچینەی ڕووانین و ووردبینی بێت .

## داواکاریەکان:

١- قاپ یان کیس

٢-شیرنەمەنی



# یاری گەنجینە ( قاسە )



ئایا حەزت لێیە قاسەیەك بە دەست بێنیت؟ ئەم یارییە پشت دەبەستێ بە شاردنەوەی قاسەیەك یان دیاریەك لە شوێنێك پاشان دانانی کاغەزێك کە ڕستەیەك یان ووشەیەکی تێدا بێت ئاماژەبکات بۆ شوێنی قاسەکە یان ئاماژە بێت بۆ شوێنێکی تر کە قاسەکەی لێ بدۆزرێتەوە یان ئاماژەبێت بۆ شوێنێکی تر وەئەوەی قاسەکە بدۆزێتەوە دەیباتەوە.

**داواکاری :**

١-چەند کاغەزێك کە شوێنەکانی لەسەر نوسرابێت.

٢-دیاریەکان.





# یاری وێنەکێشان بە چاو داخراوی



یاریزانــان کاغــەز و قەڵەمــەکانیان پێــدەدرێت و چــرا یــان گڵۆپــەکان دەکوژێنرێنـــەوە داوایـــان لێ دەکرێـــت وێنـــەی گوێدریـژێك یـان دارێك یـان هـەر شـتێکی تـر لەسـەر کاغەز بکێشن ، وەکاتێك گڵۆپەکان ڕۆشندەکەنەوە وێنەکان دەبینن و ددبێتـە هـۆی پێکـەنینی هـەموان و سـەرکەوتوو ئەوەیە جوانترین وێنەی کێشاوە .

وددەتوانرێت ئەم یاریە جێبەجێ بکرێت لە ڕوناکیشدا ،



بەڵام بە پشت بەستن لەسەر سەرڕاستی یاریزانان لە نوقاندنی چاوەکانیان یان بەستنی چاوەکانیان.

وەدەتوانین دووای ئەوە لەسەر نیعمەتی بینین بدوێن کە پێمان دراوە و سوپاسی خوا بکەین کە ئەم نیعمەتەی پێ بەخشیوین.





# یاری خواردنی خەیاری بەستراوە بە پەت

داواکراوەکان:

٢خەیار + خێتی درومان (بەنی درومان )+ پەت.



## پێشبڕكێ :

لە نێوان دووكەس یان زیاتر.

## شێوازی یاریەكە :

دوو خەیار دەبەستین بە ناوەڕاستیانەوە بە بەنی درومان لە نێوانی دووستون یان دوو دار دەیان بەستین بە پەتەكەوە. پاشان دوو خەیارە هەڵواسراوەكە شۆڕ دەكەینەوە بە بەتی درومان.

وەلەكاتی سافیرەی دەستپێكردن هەریەكێكێك لەوان هەڵدەستێت بە خواردنی خەیار بە دەمی و نابێت دەست بەهیچ شێوەیەك بەكاربهێنێت یان دەستەكانی دەبەسترێتەوە بە پشتەوە وەئەوەی یەكەم جار خەیارەكە دەخوات براوەی یەكەمە.



# یاری لیستی کڕین و فرۆشتن



هەرکەسـێك بیرکردنـەوەی زیـاتر بێـت لـەم یارییـە دەباتەوە.

لەسەر منداڵان پێویستە دابنیشن بەشێوەی بازنەیەك پاشان منداڵی یەکەم دەڵێت ڕۆیشتم بۆ بازاڕ و شتێکم کڕی یاریزانی دووەم بەهەمان شێوە ئەو ووشەیە دەڵێت ئەوەی ئەو ووتویەتی و کەل و پەلێکی دیکەشی بۆ زیاد دەکات بەو شێوەیە تاوەکو یەکێك لە منداڵەکان شتێکی لەبیردەچێت کە یاریزانەکان ووتویانە بەمەش لەیاریەکە دەچێتە دەرەوە و ئەو منداڵەی لە کۆتایدا دەمێنێتەوە براوەی یاریەکە دەبێت.



# یاری گەڕان لە دراوەکان

## ئایا هەموومان حەزمان لە کڕین و فرۆشتن نییە بە منداڵانیشەوە؟

ئەم یاریە گونجاوە بۆ کۆتایهێنان بە ئاهەنگ.

شوێنێك ئامادەبکە یان مێزەیەك کە شیرینی لەسەر بێت لەگەڵ یاری منداڵی گچکە بەمەبەستی دابەشکردن بەسەر منداڵان پاشان داوا لە ئامادەبووانی میوان بکە کە ئەو کەل و پەلانە بشارنەوە دووای ئەوە داوا لە منداڵان بکە کە لەشتەکان بگەڕێن و ئەوەی دۆزیانەوە بەخت و چانسی خۆیانە و دەبێت هەر منداڵەو یەك شت بدۆزێتەوە.





# یاری دەفڕێت یان نافڕێت ؟



**منداڵان حەزیان لە فڕینە بەڵام ئایا دەزانن؟**

داوا لە منداڵان بكە كەلەبەردەمت بووەستن لە شێوەی نیوە بازنەیەك پاشا ناوی گیانداران و باڵندەكانیان پێ بڵێ ئەگەر گیاندارەكە دەفڕێت دەستەكانیان بەرزدەكەنەوە وەكو باڵ و دەیجوڵێنن ، بەڵام ئەگەر نەدەفڕێ ئەو ناوی كە دەیڵێت دەستەكانیان بە جێگیری دە هێڵنەوە وەئەوە كە هەڵە دەكات لە یاریەكە دەردەكرێت و ئەو كەسەی لەكۆتایدا بەتەنها



دەمێنێتەوە براوەی یاریەکەیە.

## داواکاریەکان:

کاغەزێك کە ناوی گیاندار و باڵندەی تێدا بێت.





# یاری پارێزبکە لەسەر جێگیربونت و مەجوڵێ



## ئایا منداڵان دەتوانن جێگیربن لەسەر یەک جوڵە؟

ئەم یاریە وەڵامی ئەم پرسیارە دەداتەوە .

مۆسیقا لێبدە و هەمو یاریزانان با بسوڕێنەوە تاوەکو مۆسیقاکە بەردەوام دەبێت و کاتێکیش مۆسیقاکا



دەوەستێت پێویستە یاریزانان بووەستن بەبێ هیچ جوڵەیەك وەئەو یاریزانەی دەجوڵێت لەیاریەکە دەردەکرێت . وەبەو شێوەیە چەند جارێکی تریش مۆسیقاکە لێ بدە تاوەکو وای لێ دێت تەنها یەك منداڵ دەمێنێتەوە کە براوەی یاریەکەیە.
تێبینی: دەتونرێت ئامێری مۆسیقا بەکاربهێنرێت لەبری کاسێت .

**داواکاریەکان :**

کاسێت - شریتی مۆسیقا یان ئامێرێکی مۆسیقی.





# یاری ئەوە کێیە؟



## کێ خاوەنی ئەو وێنەیە ؟

هەستە بە دانانی وێنەیەك لەسەر تابلۆیەك وەبەهەڵگەڕاوەی بیلکێنە ، پاشان واز لەمنداڵان بێنە پرسیارێك بکەن و وە وەڵامیان بدەوە بەبەڵێ یان بە نەخێر تاوەکو دەگەن بە شیکردنەوە و وەڵامی ڕاست .

دەتوانرێت وێنەی ئاژەڵان یان خواردن یان هەر شتێکی تر دابنێیت.

داواکاری :

تابلۆیەك لەسەری کێشرابێت وێنەی ئاژەڵان یان خواردن.



# یاری کێ یەکەمین جار دەیپۆشێت ؟

یاریەکی خەمڕەوێنە قیاس لەسەر خێرای منداڵان لە پۆشینی جل و بەرگیان دەکرێت.



ژمارەیەکی یەکسان لەجل و بەرگ دابنێ وەکو ( دوو کراس + کولاو + پانتۆڵ + مەکسی کچان + وەزیاتر لە چەند مەکسیەکیش دەبێت ) لە ناو دوو جانتا دابن وەهەر یاریزانێك جانتایەکی پێ بدەو داوایان لێ بکە گەر ووتنی ووشەیەك کەلەدەمم دەردەچێت دەست بکەن بە پۆشینی جل و بەرگەکان بەسەر یەکدیدا . ئەو یاریزانەی لە پێش هەموویان لە پۆشینی هەموو جل و بەرگەکان دەبێتەوە براوەی یاریەکەیە.

**داواکراوەکان:**

جانتا+ شەرووال + مێزەر + مەکسی + تیشێرت + کولاو + پێلاو





# یاری بیری بەهێز

## ئەم یاریەبۆ مندالأن و گەورانە

١٢ وێنه لەشتی جیاواز بلکێنه لەسەر تابلۆیەك وەلەپاشان تابلۆكە نیشانی پێشبڕكێكاران بدە بۆ ماوەی چەند چركەیەكی كەم و دووای ئەوە بیشارەوە لەبەردەمیان بەخێرای پاشان چەند خولەكێكیان بدەیٚ بۆ بیركردنەوە لە وێنە هەڵواسراوەكە ئەو پێشبڕكێكارەی زۆرترین شتی وێنەكەی بیردەكەوێتەوە ئەوە سەركەوتووی ئەم یاریەیە. وەلەوانەیە بكرێت لە نێوان دوو تیپیشدا

وەئەگەر دەتهەوێت بیكەی لەگەڵ گەورەكان لەسەر زەوی دابنێ ٢٤ شتی جیاواز وەكو (چەقۆ مەقەس قەڵە .....هتد)





.پاشان ئەم شتانە داپۆشەو داوا لە گەنجان بکە ئەو شتانە دەست نیشان بکەن کەبینیویانە و بیریان دێتەوە.



